## ناسنامەی کتێب

**ناوی پەرتووك** : پووختەیەک لە ژیانی حَبرْ الأمة وتَرجمان القرآن عبد الله بن عبَّاس

**نوسین و شیکردنەوەی** : کاروان کەمال کوردی

**پێداچوونەوەی : هەندرێن هەژار**

**نەخشەسازی ناوەوە** : پەرجان دۆسکی

**ژمارەی پەڕە**: ٥٥

**ساڵ**: ١٤٤٤هـــ

ناونیشانی کەناڵ لە تەلەگرام: https://t.me/karwankamall١

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

بە پێویستم زانی خوێنەری موسڵمان ئاشنا بکەم بە یەکێک لە هاوەڵە بەڕێزەکانی ئوممەت، هاوەڵێک خاوەن پێگە و فەزڵێکی تایبەت ، دەتوانم بڵێم : یەکێک لە کاریگەرترین هاوەڵانی ئوممەت بەسەر زانستی شەرعی و دیندا، بەتایبەت ( تەفسیر )، هاوەڵی بەڕێز ( عبدالله بن عبّاس بن عبد المطَّلب ) بێگومان لە ڕووی فەزڵەوە سابقین خاوەن فەزڵن و، پلەیان لای الله عزوجل بەرزترە ، دەیەها هاوەڵی (بەدری) هەیە کەس نایناسێ و لە کاتێدا إبن عباس کە لە هاوەڵە بچووکەکانە بەڵام ناسراوترینە و، دیارترینە، واتە یەکێکە لە دیارترینەکان ، بێگومان ئەوەش بەهۆی زانستەکەی، سەرەکیترینیان بەهۆی کاریگەری و بەرەکەتی تایبەتی دوعای پێغەمبەرە بۆی علیه الصلاة و السلام ، بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت کاتێ گوترا إبن عباس وادەڵێ بزانێت و تێبگات، واتە دەریایەک لە زانست وادەڵێ ، تێبگات کە تەفسیری ئەو هاوەڵە بەڕێزە بەهۆی دوعای پێغەمبەر کاریگەرترین و پێکاوترین تەفسیرە بۆئایەتەکان .

چونکە سیفەتی مرۆڤ وایە تاوەکو شتێک نەناسێت گرنگی پێنادات ، لێرەوە کە خوێنەر تێگەیشت و زانی هاوەڵی بەڕێز إبن عباس کێیە و چ فەزڵ و پێگەیەکی هەیە ئەوکات تێدەگات ، وتەی ئەو جیاواز و پڕ بایەخترە و زیاتر جێگای تێڕامانە، بێگومان هیچ هاوەڵێک معصوم نییە، بەڵام هیچ هاوەڵێکیش لە بابەتی عەقیدە و بیروباوەڕ پێچەوانەی پێغەمبەری نەکردووە .

بۆیە داواکارم الله عزوجل ئەو کارەمان لێ قبوڵ کا و بیکاتە هۆی هەڵوەرینی تاوانەکانمان.

**ناوی و نەسەبی** : عبداللەی کوڕی عەباسي کوڕی عبد المطلب کوڕی هاشم کوڕی عبد مناف ە.

**کونیەیی** : أبو العباس بوو.

**دایکی ناوی** : لبابة ی کچی الحارث کوڕی حزن کوڕی بجیر الهلالیة.

کە دەکاتە خوشکی دایکی ئیمانداران ( میمونة ) خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

**سالّی لەدایکبوونی** : سێ سالّ پێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە لە دایک بووە، لە دۆلّی بەنی هاشم.

بۆ ماوەی ٣٠ مانگ هاوەلّێتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردووە.

فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هەروەهـا لە کۆمەلّێـك لە هاوەلانیش، لەوانیش هەریەك لـــە : عُمَرَ بن الخطاب ، وَ عَلِيٍّ بن أبي طالب ، وَمُعَاذٍ بن جبل ، هەروەها باوکی خۆی کە دەکاتە عباس، دواتر عَبْدِ الرَّحْمَنِ بنِ عَوْفٍ، وَأَبِي سُـفْيَانَ صَـخْرِ بنِ حَرْبٍ، وَأَبِي ذَرٍّالغاري ، وَأُبَيِّ بنِ كَعْبٍ، وَزَيْدِ بنِ ثَابِتٍ، و جگە لەوانیش.

**هەروەها قورئانی خوێندووە بەسەر هەریەك لە** : أُبَيٍّ بن كعب و زَيْدٍ.

**قوتابییە دیـــارەکـــــــانی إبن عبـاس:**

یاخود ناوی ئەوانەی کەوا فەرموودەیان لێوە ریوایەت کردووە، یان ئەسەری تەفسیریان لێوە ریوایەت کردووە، لەوانیش ؛

عَبْدُ اللهِ بنُ مَعْبَدٍ .

خادمەکانی ؛ عِكْرِمَة، ومِقْسَم ، وكُرَيْبٌ

وَأَبُو مَعْبَدٍ نَافِذٌ

أَنَسُ بنُ مَالِكٍ

أَبُو الطُّفَيْل عامر بن واثلة الليثي

وَأَبُو أُمَامَةَ بنُ سَهْلٍ، و براکەی.

؛ كَثِيرُ بنُ العَبَّاسِ، وَعُرْوَةُ بنُ الزُّبَيْرِ، وَعُبَيْدُ اللهِ بنُ عَبْدِ اللهِ بن عتبه، وَطَاوُوْسٌ بن كيسان،و سعيد بن المسيب وە القاسم بن محمد بن أبي بكر وە أبو مجلز لاحق وَأَبُو الشَّعْثَاءِ جَابِرٌ، وَعَلِيُّ بنُ الحُسَيْنِ، وَسَعِيْدُ بنُ جُبَيْرٍ، وَمُجَاهِدُ بنُ جَبْرٍ، وَالقَاسِمُ بنُ مُحَمَّدٍ؛ وَأَبُو صَالِحٍ السَّمَّانُ، وَأَبُو رَجَاءٍ العُطَارِدِيُّ، وَأَبُو العَالِيَةِ، وَعُبَيْدُ بنُ عُمَيرٍ، و کوڕەکەی؛ عَبْدُ اللهِ وَعَطَاءُ بنُ يَسَارٍ، وَإِبْرَاهِيْمُ بنُ عَبْدِ اللهِ بنِ مَعْبَدٍ، وَأَرْبَدَةُ التَّمِيْمِيُّ -و عبيدالله بن أبي يزيد المكي و أبي زميل الحنفي سماك بن الوليد و نافع بن جبير بن مطعم و أبي الجوزاء ربعي أوس بن عبدالله و أَبُو صَالِحٍ بَاذَامُ، وَطَلِيْقُ بنُ قَيْسٍ الحَنَفِيُّ، وَعَطَاءُ بنُ أَبِي رَبَاحٍ، وَالشَّعْبِيُّ، وَالحَسَنُ، وَابْنُ سِيْرِيْنَ؛

وَمُحَمَّدُ بنُ كَعْبٍ القُرَظِيُّ، وَشَهْرُ بنُ حَوْشَبٍ، وَابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، وَعَمْرُو بنُ دِيْنَارٍ، وَعُبَيْدُ اللهِ بنُ أَبِي يَزِيْدَ، وَأَبُو جَمْرَةَ نَصْرُ بنُ عِمْرَانَ الضُّبَعِيُّ، وَالضَّحَّاكُ بنُ مُزَاحِمٍ، وَأَبُو الزُّبَيْرِ المَكيِّ، وَبَكْرُ بنُ عَبْدِ اللهِ المُزَنِيُّ، وَحَبِيْبُ بنُ أَبِي ثَابِتٍ، وَسَعِيْدُ بنُ أَبِي الحَسَنِ، وَإِسْمَاعِيْلُ السُّدِّيُّ . زۆرێکی تر .

**دەڵێم** : الذهبي( الحسن البصري ) ی لەڕیزی قوتابیەکانی إبن عباس هێناوە ، بەڵام ڕای راجح و و دروست ئەوەیە کەوا (حسن ) گوێی لێی نەبووە، پێشەوا (علي إبن المديني ) لە( العلل ) هێناویەتی ڕوونی کردۆتەوە بەوەی ریوایەتی حسن لەو مرسلە یان( منقطعة ).

- ژمارەی فەرموودەکانی هاوەڵی بەڕێز ( ابن عباس رضي الله عنهما ) لە الكتب الستة =[ **١٢٢١** ] حديث
- لە بارەی تێکڕایی ریوایەتەکانی الذهبي لە سير دەڵێت:

**١٦٦٠** فەرموودەی مسندی هەیە.

**دەڵێم**: بە مکرر واتە دووبارەوە.

هەروەها فەرموودەی لە الصحيحين **٧٥** ریوایەتە.

زۆرترین فەرمووده عكرمة ی خادمی لێوەی ریوایەت کردووە کە دەگاتە

[ ٣٠٠ ] حديث.

واتە بە نزیکەیی دەگاتە ( ربع ) چارەگیک.

هەروەها زۆرینەی سەنەدەکانی إبن عباس زیاتر تەفسیرن .

کەوا عکرمە و سعيد بن جبير ئینجا مجاهيد لێوەیان ریوایەت کردووە.

## پێگەو پلەی ئـەو هاوەڵە بەڕێز:

پێش دەستپێک پێویستە ئەوە بزانرێت کەوا زۆرێک لە هاوەڵە بەڕێزەکان ( فضائل ) یان هەبووە ، لەو بارەوەش کتێب زۆر لەسەر (فضائل ) نوسراوە، وەك فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل.

هەروەها لە کتوبی الستة کە دەکاتە ( البخاري و مسلم و أبو داود و الترمذي و النسائي و ابن ماجه ) کتابی تایبەت ، یان سەرەباسی تایبەتیان لەسەر [فضائل ] نوسیوە ، هەریەکێکیان بەچەند پلە و تایبەتمەندییەك باسکراوە، لەنێو فضائلي ئەو هاوەڵانەش هاوەڵی بەڕێز ( عبدالله بن عباس ) هەیە، ئەوەی پلەی ئەو هاوەڵە جیا دەکاتەوە لە هاوەڵانی تر ئەوەیە کەوا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە تایبەت دوعای بۆ کردووە کەوا الله عزوجل فەهم و تێگەیشتنی زیاتر و زۆر تر بکات لەقورئان بەو شێوە:

پێشەوا البخاري هێناویەتی " **اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ** " ، لە ریوایەتێکی تر دەفەرموێت : ( **عَلِّمْهُ الْكِتَابَ** ) . [1]

واتە : داوای کردوە و پاڕاوەتەوە بەوەی الله عزوجل شارەزایی بکات لە کتابەکەی کە ( قورئانە ).

پێشەوا مسلم لە وَرْقَاءُ بْنُ عُمَرَ الْيَشْكُرِيُّ هێناویەتی دەڵێ : سَمت عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي يَزِيدَ يُحَدِّثُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى الْخَلَاءَ، فَوَضَعْتُ لَهُ وَضُوءًا، فَلَمَّا خَرَجَ قَالَ : " **مَنْ وَضَعَ هَذَا** ؟" فِي رِوَايَةِ زُهَيْرٍ : قَالُوا، وَفِي رِوَايَةِ أَبِي بَكْرٍ : قُلْتُ :

ابْنُ عَبَّاسٍ. قَالَ : " **اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ**." [2]

واتە : ابن عباس دەفەرموێت : پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕۆیشت بۆ سەرئاوکردن ، منیش ئاوی دەستنوێژم بۆی دانا ، کاتێ هاتەدەرەوە فەرمووی : کێ ئەوەی داناوە ؟ دەڵێ گوتم : من.

فەرمووی : یا الله شارەزایی بکە یان تێگەیشتووی بکە لە دین.

---

(١) صحيح البخاري : كتاب فضائل أصحاب النبي ، ٣٧٥٦ .

(٢) صحيح مسلم ح :٢٤٧٧ ( كتاب فضائل الصحابة ).

وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: دَعَا لِي رَسُوْلُ اللهِ بِالحِكْمَةِ مَرَّتينِ :

هەروەها عبدالله بن عباس دەفەرمووێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوو جار دوعای بۆ کردووم.[١]

لەبارەی وشەی ( الحكمة ) ەوە فەرموودەناسان لە زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەڵێن :

- واتای قورئانە.
- یان دەڵێن : کارکردنە پێی.
- یان دەڵێن : سوننەتە.
- یان دەڵێن : پێکانە لە قەولدا.
- یان دەڵێن : ترسانە.

(١) ابن سعد هێناویەتی لە طبقات [٢ / ٣٦٥ ]لەڕێگای القاسم بن مالك، عن عبد الملك، عن عطاء، عن ابن عباس.

و البلاذري [ ٣ / ٢٨] لەڕێگای يحيى بن آدم، عن أبي كدينة يحيى بن المهلب البجلي، عن أبيه، عن مجاهد، عن ابن عباس.

والترمذي ( ٣٨٢٣) لە ڕێگای عطاء عن ابن عباس قال: دعا لي رسول الله صلى الله عليه وسلم أن أوتى الحكمة مرتين.

- یان دەڵێن : تێگەیشتنە لەلایەن الله وە عزوجل.
- یان دەڵێن : عەقڵە ...... الخ .

بەڵام ، نزیکترین ڕا و پێکاوترینیان ئەوەیە دەڵێت:

- تێگەیشتنە لە قورئانی پیرۆز.

## شیکردنەوە:

بۆ ئەو دوعایەی پێغەمبەر صلی الله علیه کە بۆ ئەو هاوەڵە بەڕێزە کردوویەتی.

پێش هەموو شت پێویستە ئەوە بزانن کەوا دوعای پێغەمبەری الله بۆ هەر کەسێک لە هاوەڵان کردبێتی قبوڵ بووە ،چونکە دوعای پێغەمبەران قبوڵە ، بۆ نمونە : جوولەکەکان لە مەدینە دەیانزانی دوعای پێغەمبەران قبوڵە بۆیە کاتێ دەیانبینی بە ئەنقەست دەپژمین و دەیانگوت الحمدلله تاوەکو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێت : (یرحمک الله )، بەڵام رسول الله دوعای هیدایەتی بۆ دەکردن .

لەو دوعایـانەی کەوا کردوویەتی بۆ هاوەڵان:

## هاوەڵی بەڕێز ئەنەسی کوڕی مالیك

هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالك دەفەرموێ : (دایکم أم سلیم) منی بردە لای پێغەمبەر ، یان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتە ماڵمان

(أم سلیم ) پێی فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا خزمەتکارەکەت أنس دوعای خێری بۆ بکە ؟

أنس دەڵێ : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی بەسەری داهێنام و دوعای کرد بەوەی الله بەرەکەت بخاتە نێو ماڵ و منداڵ و تەمەنم .

کاریگەری ئەو دوعایە بەسەر ئەنەسەوە بە جۆرێک بوو دەڵێن : أنس هێندە بەرەکەت کەوتە نێو منداڵی تا سەد منداڵ و نەوەی خۆی بینی ، هێندە بەرەکەتیش کەوتە نێو ماڵی بووە یەکێ لە دەوڵەمەندەکان ، ئەوەندە بەرەکەتیش کەوتە تەمەنی تاوەکو **١٠٧** ساڵ ژیا ،

بە جۆرێک لە ساڵی **٩٣** هجری وەفاتی کرد.

ئەمەش بۆ ئەوەیە کەوا دوعای پێغەمبەران ڕەتناکرێتەوە.

## هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة رضي الله عنه:

أبو هريرە سکاڵای ئەوەی کرد لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەوەی ئەو فەرموودانەی لەبەری دەکاتن بیری دەچێتەوە ؟

پێغەمبەری الله صلى الله عليه وسلم داوای لێکرد جلەکەی دابنێ و بیخاتە سەر زەوی و دوعای لەسەر کرد، ئینجا فەرمووی هەڵیگرەوە.

کاریگەری ئەو دوعایە بووە هۆی ئەوەی ئەو هاوەڵە بەڕێزە دواتر یەک فەرموودەشی بیرنەچێتەوە تا مردن.

هەندێ لە ئەمیرو سەرکردەکان بانگی هاوەڵی بەڕێز أبو هريرەیان کرد بەوەی هەندێ فەرموودەیان بۆ باس بکاتن ، بەنهێنیەوە نوسەرێکیان گرتبوو بۆ ئەوەی هەر وشەیەک لە دەمی دێتەدەر بینووسێتەوە، أبو هريرة فەرموودەی دەگوت و نووسەریش دەینووسیەوە ، ئینجا دوای یەک ساڵ ئەمیر بانگی أبو هريرة ی کرد و داوای کرد بۆی باسبکاتەوە ، کەسێکی بە نهێنی ڕاسپاردبوو ئەو کتابە بخوێنێتەوە کەوا پێشووتر نوسیبوویان ، ئینجا أبو هريرە دەستی کرد بە گێڕانەوەی فەرموودەکان بە جۆرێک یەک

وشەی نە زیاد کرد، نە کەمیش کرد، هەروەها نە پێشی خست و نە دواشی خست[1].

بەهۆی کاریگەری ئەو دوعایەوە بووە بە حافظ ترین هاوەڵی ئوممەت ، بە جۆرێک هیچ یەکێک وەک ئەو فەرموودەی زۆری ریوایەت نەکردووە و وەکو ئەویش حافظ نەبووە ، گەرچی موسڵمانبوونی لە خەیبەردا بوو، بۆیە زۆرێک گلەییان دەکرد بەوەی أبوهريرة زۆر فەرموودە باسدەکات و درەنگیش مسڵمان بووە.

یان کاتێ( **أم حرام بنت ملحان** ) داوا دەکات لەو شەهیدانە بێت کەوا غەزای نێو دەریا دەکەن و دەپەڕنەوە ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوو جار دوعای بۆ دەکات کەوا لەوان بێت.

أم حرام خێزانی عبادة بن صامت بوو، کاتێ لە دەریا دەپەڕینەوە بۆ جیهاد لەکاتی دابەزین لەسەر وڵاغەکەی دەکەوێت و دەمرێت و شەهید دەبێت.

(١) (الحاكم في المستدرك ، ٥١٠/٣ والذهبي في (سير أعلام النبلاء ٥٨٩/٢، ئینجا حاکم دەڵێ : ئەوەیە حفظ بەو شێوەیە ) .

دوعاكان زۆرن، بۆ نمونە : كاتێ پیغەمبەر ﷺ لە مەككە دوعا لەسەرانی قوڕەیش دەكات و دانە دانە ناویان دەهێنێ، دوای چەند ساڵێكی كەم هەموویان دەكوژرێن ، هەتا یەكێ لەسەرانی كافرانی قوڕەیش پێش ئەوەی جاڕی جەنگ لێبدرێ بۆ بەدر لەپێشدا سعد بن معاذ پێی گوتبوو كەوا دەكوژرێ، چونكە پێغەمبەر هەواڵی پێداوە ، ئەویش هێندە دڵنیا بوو لەوەی دوعای پێغەمبەر قبوڵە لە ترسان حەزی نەدەكرد بچێتە جەنگ، بەڵام دواتر لە شەرمان بە ناچاری ڕۆیشت و كوژرا.

لەو نمونـانە و سەدان نمونەی تر ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كەوا دوعای پێغەمبەر هەمیشە بۆ هاوەڵان قبوڵ كراوە ، لەنێویان هاوڵی بەڕێز( إبن عباس ) كەوا بە تایبەت دوعای بۆ كردووە كە الله شارەزا و تێگەیشتووی بكات لە قورئان و دین ، بێگومان دوعاكەی بەجۆرێك گیراوە بۆ ئەو هاوەڵە تاوەكو بووە زیرەكترین و ناودارترین موفەسیری تەفسیری قورئان لە هەموو ئوممەت، دواتر زیاتر بۆتان ڕوون دەبێتەوە كاریگەری دوعاكەی چۆن بووە، بەڵام ئەوەی گرنگە و پێویستە بزانین

ئەو هاوەڵە بەڕێزە جیاوازە لە هاوەڵانی تر لەو لایەنە، چونکە بەتایبەت دوعای بۆکراوە.

## پێگەی إبن عباس لای هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

### پێگەی إبن عباس لای پێشەوای ئیمانداران عمر بن الخطاب:

عبدالله بن عباس دەڵێت : عمر منی لەگەڵ شێخەكانی بەدر دادەنا، هەندێکیان شتێک لە نەفسیان درووست بوو، و گوتیان:

لەبەرچ شتێک ئەوە لەگەڵ ئێمەی دادەنێت لەکاتێکدا ئێمە مندالّمان هاوشێوەی ئەوەیە ؟ عمر پێیگوتن : ئەو بەو شێوەیە کە ئێوە دەیزانن ( واتە وەك ئێوە زانایە بە دین ) ڕۆژێکیان عمر بانگی کردم ، منی لەگەڵیان بردە ژوورەوە ، وام گومان برد تەنها بۆ ئەوەبێت تا من ببینن ، ئینجا عمر پێی فەرموون : چی دەڵێن لەبارەی ئایەتی :{ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ} ؟ هەندێکیان گوتیان :فەرمانمان پێکراوە بەوەی سوپاسی الله بکەین و تۆبە بکەین کاتێک کەوا سەرکەوتنمان بۆهات ، هەندێکیان بێدەنگ بوون و هیچ شتێکیان نەگوت ، ئینجا عمر بە منی گوت : ئایا تۆش هەر بەو شێوە دەیڵێی؟ گوتم : نەخێر

گوتی باشە دەڵێی چی ؟ گوتم ئەوە مردنی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم تا بزانێت ، { إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ } ئەوە نیشانەی مردنی تۆیە بۆیە { فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا }. هیچ شتێک نازانین لێی مەگەر بەوەی تۆ دەیلێی. (١)

**دەڵێم** : ئەو فەرموودە بە کۆمەڵێك ریوایەت هاتووە ، لەوانە:

ئەوەی کە بە عمر دەڵێ بۆچی لەگەڵمانی دادەنێیت عبدالرحمن بن عوف بووە.

هەروەها ئەو باسە بەڵگەیەکی ڕوون و زۆریش گرنگە بۆ ئەوەی موسڵمان بزانێت عبدالله بن عباس لە زیرەکی و دانایی هاوتایی هاوەڵە هەرە پلە بەرزەکانی ئوممەتە، بگرە لە سەرووی زۆرینەی زۆریانەوە لە ڕووی زانستی شەرعی، بۆیە پێشەوا عمر زۆر گرنگی پێدەدا، هەر خودی

(١) (البخاري : كِتَابُ التَّفْسِيرِ. | سُورَةُ : إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ. | بَابٌ : قَوْلُهُ : فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ. ٤٩٧٠ وە الترمذي : أَبْوَابُ تَفْسِيرِ الْقُرْآنِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ | بَابٌ : وَمِنْ سُورَةِ الْفَتْحِ ٣٣٦٢ و مسند أحمد مُسْنَدُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ. ٨٥ )

ئیمامی عمر لە لووتکەی زانسدا بووە، بەڵام بۆ ئەوە إبن عباسی داناوە تاوەکو بزانرێت لێهاتووە و دانایە.

خاڵێکی زۆر گرنک کە پێویستە تەرکیزتان بخەنە سەری ئەویش ئەوەیە (علم) هەڵگرانی بەرز دەکاتەوە، گەر دیقەت بدەن پێشەوا إبن عباس ئەو کاتەی پێغەمبەر وەفاتی کرد تازە بالغ بوو، یان کاتێک ئیمامی عمر لە کۆڕو کۆبوونەوەکان دایدەنا سەرەتایی بیستەکانی بوو، واتە( بیست ساڵی)، بەڵام ئیمامی عمر لەگەڵ ئەشیاخی [ بەدر ] دایدەنا کە تەمەنیان پەنجاو شەست و حەفتا ساڵی بوون، هەروەها ئەوان لە عیلمدا لە لووتکە بوون ، ئینجا پێشەوا عمر پێی دەگوتن: ئەوە وەك ئێوەیە لە عیلم دا ، سبحان الله ئەوە پێگەی ئەو هاوەڵە بەڕێزەیە لە ڕووی زانستی شەرعیەوە.

پێشەوای ئیمانداران (عمر بن الخطاب) لەخۆی نزیك دەکردەوەوە ڕێزی دەگرت و لەکۆڕو مەجلیسی ڕاوێژدا لەگەڵ شێخەکانی نێو هاوەڵان دایدەنا ، و دەیگوت: چاکترین تەرجومانی قورئان إبن عباس ە.(١)

---

(١) تأريخ البغداد للخطيب البغدادي ج١ ص٥٢٢

سعيد بن جبير دەڵێ پێشەوا عمر بن الخطاب دەیفەرموو:

لۆمەم مەکەن لە خۆشویستنی إبن عباس.(١)

هەروەها دەڵێت : پێشەوا عمر بە إبن عباسی دەگوت:

بەڕاستی تۆ زانست و زانیارییەك فێرکراویت کە ئێمە نایزانین.

مەبەستی لە لێکدانەوەی تەفسیری قورئانە.

دەڵێم : لە ڕووی سەنەدەوە ئەو ئەسەرەی سعيد بن جبير ( **منقطعة** )، چونکە سعيد نەك گوێی لە عمر نەبوو، بەڵکو زیاتر لە بیست ساڵ دوای وەفاتی عمر ئینجا لەدایکبووە.

عبدالله بن عباس دەڵێ : باوکم پێیگوتم: ئەی کوڕەکەم عمر زۆر لەخۆیت نزیک دەکاتەوە و ڕێزت دەگرێ، بۆیە ئەو سێ ئامۆژگارییە لەمنەوە وەربگرە :

بەهیچ جۆرێ نهێنیەکانی مەدرکێنە.

(١) (سير أعلام النبلاء )

هەرگیز لای ئەو غەیبەتی هیچ کەسێك مەکە.

بەهیچ شێوەیەك درۆت لێ نەبینێت.[١]

## پێگەی إبن عباس لای أبي بن كعب:

مُحَمَّدِ بنِ أُبَيِّ بنِ كَعْبٍ؛ سَمِعَ أَبَاهُ يَقُوْلُ - وَكَانَ عِنْدَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ، فَقَامَ -، فَقَالَ:

هَذَا يَكُوْنُ حَبرَ هَذِهِ الأُمَّةِ، أَرَى عَقْلاً وَفَهْماً، وَقَدْ دَعَا لَهُ رَسُوْلُ اللهِ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَنْ يُفَقِّهَهُ فِي الدِّيْنِ.

محمد بن أبي بن كعب گوێی لەباوکی بوو دەیگوت : لەکاتێکدا إبن عباس لای ئەو بوو هەستا و فەرمووی : ئەوە دەبێتە ( حبر )ی ئەو ئوممەتە ، من عەقڵ و تێگەیشتنی لێدەبینم ، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دوعای بۆ کردووە بۆ ئەوەی شارەزا و تێگەیشتوو بێت لە دیندا.

(١) الحلية الأولياء " ١ / ٣١٨، و" أنساب الاشراف " ٣ / ٥١، وو " الطبراني " (١٠٦٩) ، والفسوي ١ / ٥٣٣، ٥٣٤ .

## پێگەی إبن عباس لای عبدالله بن مسعود:

عبدالله بن مسعود دەفەرمووێ : چاکترین موفەسسیری قورئان إبن عباسە.

جا دەڵێت : گەر ئەو غولامەی بەنی عبدالمطلب بگەیشتبا بەوەی ئێمە پێی گەیشتووین ئەوا هیچ یەکێکمان وەك ئەو تێگەیشتوو نەدەبووین.[1]

## پێگەی إبن عباس لای معاوية بن أبي سفيان:

عکرمە دەڵێت : گوێم لە معاوية بوو پێی دەگوتم : مەولای تۆ (مەبەست پێی إبن عباس ) ە، شارەزاو تێگەیشتووترە لەوانەی کە مردوون و لەوانەشی کە ماون.

## پێگەی إبن عباس لای عائشة رضي الله عنها:

لە دایکمان عائشەوە الله لێی ڕازی بێت ریوایەت کراوە دەڵێت : زاناترین کەس بە فەریزەی حەج کە نەمردبێ و مابێت إبن عباسە.[2]

(١) سير سلف الصالحين ج ٤٨١ و تأريخ الخطيب ج ١ ص ٥٢٥

(٢) (" تاريخ الفسوي " ٤٩٥/١ وە" ابن سعد "٣٦٩/٢ وە سير أعلام النبلاء للذهبي )

## پێگەی إبن عباس لای إبن عمر:

نافع لە إبن عمر هێناویەتی دەفەرمووێت:

(إِنَّ حَبْرَ هَذِهِ الأُمَّةِ ابْنُ عَبَّاسٍ)[١].

بەڵام سەنەدی ئەو قەولەی إبن عمر لاوازە، وەك الذهبي ئاماژەی پێداوە.

## دەڵێم:

لەهەموو ریوایەتەکان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا پێگەی إبن عباس لە ڕووی زانستی شەرعیەوە بووە ، هەروەها ئەوانەی ڕێزیان لێگرتوە لە دانا و زاناترینەکانی ئوممەتن ، وەك:

عمر و عبدالله بن مسعود و أبي بن كعب و عائشة الخ.

کەواتە پێویستە بزانرێ کەوا هاوەڵی بەڕێز جیاواز بووە لە ڕووی زانستی شەرعی و تەفسیرەوە، جیاواز لەزۆرینەی تری هاوەڵان، هەڵبەتە

(١) ( سير أعلام النبلاء للذهبي ).

کاتێک قسەیەکی کردبێ وەك پێشەوایان تابعین دەڵێن : لەکۆتایی هەر دەبێ بگەڕێنەوە بۆ قسەی ئەو ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەهەندێ باسی فیقهی خیلافی ئەوانی تر بووە.

## هەوڵدانی إبن عبَّاس بۆ فێربوونی زانستی شەرعی:

گێڕانەوەی یەکەم لە إبن عباس:

عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: مَكَثْتُ سَنَةً وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) عَنْ آيَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجًّا فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا رَجَعَ فَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، عَدَلَ إِلَى الْأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ، فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ ثُمَّ سِرْتُ مَعَهُ، فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ أَزْوَاجِهِ؟ فَقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ وَعَائِشَةُ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: وَاللَّهِ إِنْ كُنْتُ لَأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ. قَالَ: فَلَا تَفْعَلْ، مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَسَلْنِي عَنْهُ، فَإِنْ كُنْتُ أَعْلَمُهُ أَخْبَرْتُكَ، قَالَ: وَقَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ إِنْ كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَا نَعُدُّ لِلنِّسَاءِ أَمْرًا، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِنَّ مَا أَنْزَلَ، وَقَسَمَ لَهُنَّ مَا قَسَمَ، قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا فِي أَمْرٍ أَأْتَمِرُهُ إِذْ قَالَتْ لِي امْرَأَتِي: لَوْ صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا، فَقُلْتُ لَهَا: وَمَا لَكِ أَنْتِ وَلِمَا هَاهُنَا، وَمَا تَكَلُّفُكِ فِي أَمْرٍ أُرِيدُهُ؟ فَقَالَتْ لِي: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، مَا تُرِيدُ أَنْ

تُرَاجِعَ أَنْتَ، وَإِنَّ ابْنَتَكَ لَتُرَاجِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ. قَالَ عُمَرُ: فَآخُذُ رِدَائِي، ثُمَّ أَخْرُجُ مَكَانِي حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى حَفْصَةَ، فَقُلْتُ لَهَا يَا بُنَيَّةُ إِنَّكِ لَتُرَاجِعِينَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ؟ فَقَالَتْ حَفْصَةُ: وَاللَّهِ إِنَّا لَنُرَاجِعُهُ، فَقُلْتُ: تَعْلَمِينَ أَنِّي أُحَذِّرُكِ عُقُوبَةَ اللَّهِ وَغَضَبَ رَسُولِهِ (صلى الله عليه وسلم)، يَا بُنَيَّةُ، لَا يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِي قَدْ أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا، وَحُبُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِيَّاهَا. ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ لِقَرَابَتِي مِنْهَا، فَكَلَّمْتُهَا، فَقَالَتْ لِي أُمُّ سَلَمَةَ: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، قَدْ دَخَلْتَ فِي كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَبْتَغِيَ أَنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَزْوَاجِهِ؟ قَالَ: فَأَخَذَتْنِي أَخْذًا كَسَرَتْنِي عَنْ بَعْضِ مَا كُنْتُ أَجِدُ، فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهَا، وَكَانَ لِي صَاحِبٌ مِنَ الْأَنْصَارِ إِذَا غِبْتُ أَتَانِي بِالْخَبَرِ، وَإِذَا غَابَ كُنْتُ أَنَا آتِيهِ بِالْخَبَرِ، وَنَحْنُ حِينَئِذٍ نَتَخَوَّفُ مَلِكًا مِنْ مُلُوكِ غَسَّانَ، ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَسِيرَ إِلَيْنَا، فَقَدِ امْتَلَأَتْ صُدُورُنَا مِنْهُ. فَأَتَى صَاحِبِي الْأَنْصَارِيُّ يَدُقُّ الْبَابَ وَقَالَ: افْتَحِ افْتَحْ، فَقُلْتُ: جَاءَ الْغَسَّانِيُّ؟ فَقَالَ: أَشَدُّ مِنْ ذَلِكَ، اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَزْوَاجَهُ. فَقُلْتُ: رَغِمَ أَنْفُ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ، ثُمَّ آخُذُ ثَوْبِي فَأَخْرُجُ حَتَّى جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ يُرْتَقَى إِلَيْهَا بِعَجَلَةٍ، وَغُلَامٌ لِرَسُولِ

اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَةِ، فَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ، فَأُذِنَ لِي. قَالَ عُمَرُ: فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَذَا الْحَدِيثَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ حَدِيثَ أُمِّ سَلَمَةَ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَإِنَّهُ لَعَلَى حَصِيرٍ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ شَيْءٌ، وَتَحْتَ رَأْسِهِ وِسَادَةٌ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، وَإِنَّ عِنْدَ رِجْلَيْهِ قَرَظًا مَضْبُورًا، وَعِنْدَ رَأْسِهِ أُهُبًا مُعَلَّقَةً، فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْحَصِيرِ فِي جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: (مَا يُبْكِيكَ يا عمر). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ كِسْرَى وَقَيْصَرَ فِيمَا هُمَا فِيهِ، وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمَا الدُّنْيَا وَلَكَ الْآخِرَةُ)[(١)].

واتـە:

عبدالله ی کوڕی عباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ماوەی یەك ساڵ دەمویست پرسیار لە (عمر بن الخطاب خوای لێ ڕازی بێت) بکەم لەبارەی ئایەتێکەوە ، کەچی نەمدەوێرا لەبەر ئەوەی سامم دەکرد، هەتا ڕۆژێك دەچوو بۆ حەج منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم، کە گەڕاینەوە لە ڕێگەدا

(١) [البخاري / التفسير/ ٤٦٢٩ ومسلم / كِتَابٌ : الطَّلَاقُ. ا بَابٌ : فِي الْإِيلَاءِ، وَاعْتِزَالِ النِّسَاءِ. والترمذي / أَبْوَابُ صِفَةِ الْقِيَامَةِ وَالرَّقَائِقِ وَالْوَرَعِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. ا بَابٌ ٢٤٦١ وه ومسند أحمد / مُسْنَدُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ٢٢٢ واللفظ لمسلم ]

بووین، (عمر)(خوای لێ ڕازی بێت) لایدا بۆ ژێر سێبەری درەختێکی (أراك) بۆ پێویستی خۆی، بەدیاریەوە وەستام هەتا لێبویەوە، پاشان لەگەڵیدا کەوتمە ڕێ، وتم: ئەی ئەمیری ئیماندااران! ئەو دوو هاوسەرەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کێ بوون کە پشتی یەکتریان گرت بەسەر پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)؟ وتی: (حفصة) و (عائشه)بوون، پێم وت: بەخوا یەك ساڵە دەمەوێ ئەو پرسیارەت لێبکەم بەڵام نەمدەوێرا، عمر وتی: جارێکی تر وامەکە، هەر کە زانیت من شتێک دەزانم پرسیارم لێبکە، ئەگەر زانیم وەڵامت دەدەمەوە.

بەڵێ: (عمر)(خوای لێ ڕازی بێت) وتی: بەخوا ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا پلەوپایەمان بۆ ژن دانەدەنا. هەتا ئەوە بوو خودا ئایەتی لەبارەیانەوە ناردە خوارەوە، مافی خۆیانی پێدان، (عمر) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: جارێکیان سەبارەت بە مەسەلەیەك پرس و ڕای خۆمم دەکرد، ژنەکەم پێیگوتم: ئەگەر ئاواو ئاوا بکەیت چۆنە؟ منیش پێمگوت: تۆ چیت داوە لەوەی لە دڵی مندایە؟ هەر چیم لە دڵدا بێت تۆ چیت لە دەست دێت؟ ژنەکەم گوتی: ئەرێ من سەیرم لە تۆ دێ (أبن خطاب)، تۆ ناتەوێت کەس قسە و باست لەگەڵدا بکات؟ لەکاتێکدا کە کچەکەت (واتە

حفصة) ئەوەندە سەر دەخاتە سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو ڕۆژە تا ئێوارە توڕەی دەکات، (عمر) دەڵێ: منیش عەباکەم دا بە شانمدا و، پاشان ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە لای (حفصة) و چوومە ژوورەوە بۆ لای، پێمگوت: کچێ! ئەرێ ڕاستە تۆ ئەوەندە قسە لەگەڵ پێغەمبەردا دەکەیت (صلى الله عليه وسلم) ئەو ڕۆژە تا ئێوارە توڕەی دەکەیت؟ (حفصة) وتی: بەخوا ئێمە قسەی زۆری لە ڕوودا دەکەین. منیش گوتم: وریابە! بەر سزای خوای گەورە و توڕەیی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) نەکەویت. کچێ؛ نەکەی بخەڵەتێی بەو ژنەی کە بە جوانی خۆی و خۆشەویستی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەنازێ. پاشان چوومە دەرەوە تا چووم بۆ لای (أم سلمة)چونکە خزمی نزیکم بوو، قسەم لەگەڵیدا کرد، (أم سلمه) گوتی: (أبن الخطاب)! سەیرم لە تۆ دێ: خۆت لە هەموو شتێکدا هەڵدەقورتێنی، هەتا گەیشتە ئەوەی بکەویتە نێوان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوسەرەکانیشی؟ عمر دەڵێ: ئەوەندە وەڵامەکەی سەخت بوو، وازم لەهەندێ شتی تریش هێنا کە بۆی هاتبووم، لای ئەو هاتمە دەرەوە، برادەرێکی ئەنصاریم هەبوو ئەگەر دیار نەبومایە هەواڵی بۆ دەهێنام، ئەگەر ئەویش دیار نەبوایە من هەواڵم بۆ دەبرد، لەو کاتەشدا مەترسی هێرشی پادشای غەسانیان لەسەر بوو،

هەواڵمان بۆ هاتبوو کە پێدەچێ هێرشی بکاتە سەرمان، لێی پڕبوبوین. جارێکیان ئەو برادەرە ئەنصاریەم لە دەرگای ماڵەکەمی دا و گوتی: بیکەرەوە.. بیکەرەوە. وتم: ئایا (غەسسانی)ی هات، وتی: نەخێر، لەوەش خراپتر ڕوویداوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە هاوسەرەکانی دوورکەوتۆتەوە. گوتم: (حفصة)و (عائشه) بە قوڕاچن.. پاشان عەباکەم دا بەسەرشانمدا و گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبووم.. بینیم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەژوورێکی بچووکدا دانیشتووە کە بەپلیکانەیەکی دارخورما بۆی سەردەکەوتن، خزمەتکارەکەشی لەسەر پلیکانەکە بوو، گوتم: من (عمر)م، ڕێگەی دام چوومە ژوورەوە. (عمر) دەڵێ: ئەو بەسەرهاتەم بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گێڕایەوە، کە گەیشتمە قسەکەی (أم سلمة) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زەردەخەنەیەکی کرد، لەسەر پارچە حەسیرێك دانیشتبوو هیچی تری لەسەر نەبوو، سەرینێکی چەرمی لەژێر سەردا بوو، ناوەکەی بە ڕیشوی دارخورما ئاخنرابوو، لای قاچی پیرۆزیەوە هەندێ گەڵای پێستە خۆشکردن دانرابوو، لای ژور سەریشیەوە چەند پارچە پێستەیەکی خۆشەنەکراو هەڵواسرابوو، لا تەنیشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شوێنەواری حەسیرەکەی پێوەدیاربوو، منیش [کە ئەوەم دی] گریام،

فەرمووی: (عمر، بۆچی دەگریت؟) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، کیسرا و قەیسەر حاڵیان چۆنە و لە چ حاڵێکدان، تۆیش پێغەمبەری خوایت، ئەوە حاڵتە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئایا ڕازی نابی کە دنیا بۆ ئەوان بێت و قیامەت بۆ تۆ بێت؟).

دەڵێم [ الكردي ] :

بە وردبوونەوە و تێڕامان لەو باسە هەندێ شتی زۆر گرنگمان بۆ دەردەکەوێت ، ئەو فەرموودە دەیان سوودی فیقهی و زانستی و ئەدەبی تێدایەK بەڵام ئێمە تەنها سێ دانەی هەڵدەبژێرین کەوا پێویستمانە بۆ ئەو کتێبەی دەمانەوێ بینیوسین، لەوانیش:

یەکەم : هاوەڵی بەڕێز إبن عباس دەڵێت : ماوەی یەك ساڵ چاوەڕێم کرد، دەمویست پرسیاری باسێکی لێبکەم ، لێرەدا ئەو باسە تەفسیری ئایەتێکە لە ئایەتەکانی قورئان ، لەکێ بپرسێت لەئەهلی عیلم،

لەنێویان (عمر بن الخطاب ) کەواتە پرسیاری شەرعی نابێت بکرێ تەنها لە ئەهلی عیلم نەبێت ، هەروەها پێداگری و هەوڵی ئەو هاوەڵە

بەرێزە بۆ فێربوونی زانستی شەرعی ، سبحان الله تۆ یەك ساڵ (لە هەندێ ریوایەتی لاواز دەڵێ دووساڵ) بوەستی تەنها لە پێناو یەك پرسیار! کەواتە لەو ڕووداوانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا زانستی شەرعی هەوڵدانی دەوێ.

دووەم : هاندانی پێشەوای ئیماندارا‌ن، بەوەی إبن عباس دەڵێت:

یەك ساڵە دەمەوێ ئەو پرسیارەت لێبکەم بەڵام نەمدەوێرا، عمر وتی: جارێکی تر وامەکە، هەر کە زانیت من شتێک دەزانم پرسیارم لێبکە، ئەگەر زانیم وەڵامت دەدەمەوە.

پێیگوت : بەڵکو زووتر پرسیارت کردبایە مادام دەتزانی زانستم لەو باسە پێیە.

سێیەم : هەر ئەو باسە پێشەوا البخاري هێناویەتی لەشوێنێکی تر بەو شێوە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ، عَنْ عُمَرَ ، قَالَ : كُنْتُ أَنَا وَجَارٌ لِي مِنَ الْأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ وَهِيَ مِنْ عَوَالِي الْمَدِينَةِ، وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَنْزِلُ يَوْمًا، وَأَنْزِلُ يَوْمًا - فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ

بِخَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الْوَحْيِ وَغَيْرِهِ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَنَزَلَ صَاحِبِي الْأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا، فَقَالَ : أَثَمَّ هُوَ، فَفَزِعْتُ، فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ : قَدْ حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ، قَالَ : فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي، فَقُلْتُ : طَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَتْ : لَا أَدْرِي، ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ : أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ ؟ قَالَ : " لَا ". فَقُلْتُ : اللَّهُ أَكْبَرُ.(١)

واته : پێشەوا عمر دەفەرموێت : من لەگەڵ دراوسێیەکم لە پشتیوانان کە لە بني( أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ ) بوو لەبەرزاییەکانی مەدینە بوون نۆبەمان دەکرد بۆ ئەوەی بچینە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، ڕۆژێك ئەو دەڕۆیشت ڕۆژێک من دەڕۆیشتم ، ئەگەر من بڕۆیشتبام ئەوا هەواڵی ئەو ڕۆژەم بۆ دەهێنا لە دابەزینی وەحی و جگە لەوەش ، کاتێک ئەو بڕۆیشبایە بەهەمان شێوەی دەکرد ، هاوەڵە ئەنسارِیەکەم لەڕۆژی خۆی کە ڕۆیشتبوو لەدەرگای ماڵەکەی دام زۆر بەتووندی ،گوتی شتێک بووە ، منیش ترسام و دەرچووم بۆ لای گوتی : شتێکی زۆر گەورە ڕوویداوە

(١) (البخاري : كِتَابٌ : الْعِلْمُ ا بَابُ التَّنَاوُبِ فِي الْعِلْمِ. ٨٩ )

عمر دەڵێ : چوومە ژوورەوە بۆلای حفصة گوتم :ئایا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ  تەڵاقی داون ؟.

گوتی : نازانم ، ڕۆیشمە لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێمگوت و من وەستابووم ئایا خێزانەکانت تەڵاق داوە ؟

گوتی : نەخێر گوتم : الله ٱكبر.

سەیرکەن :

ئەو باسە هەمان باسی عبدالله بن عباس ە،  بەڵام پێشەوا البخاري لە كتاب العلم هێناویەتی، ئەوەش ئەوەیە کە ئێمە مەبەستمانە.

هاوەڵی بەڕێز و پێشەوای ئیماندااران عمری کوڕی خەتتاب دەڵێت : من و یەکێکی تر پێکەوە  دادەبەزین بە نۆرە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ،

بۆچی ؟ بۆئەوەی دانەبڕێن لە زانستی شەرعی بەهیچ جۆرێک ، هەر بۆیە دەبینین بوخاری دەڵێت : [التناوب في العلم ] کەواتە پێویستە تۆی خوێنەر تێبگەی و دڵنیابیتەوە لەوەی کەوا ئەگەر پێشەوا دیارەکانی ئوممەت لە هاوەڵان بەو شێوە زانستی شەرعیان بەدەست هێنابێت ، ئەوە بۆ ئێمەی نەزان زۆر لە پێشترە بۆ هەوڵدانی فێربوونی زانستی شەرعی.

گێڕانەوەی دووەم لە إبن عباس:

طاووس لە إبن عباس هێناویەتی دەڵێت : من بۆ تەنها یەك باس یان یەک پرسیار ، پرسیارم لە ٣٠ هاوەڵی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردووە.(١)

واتە تەنها یەك تەفسیر یان یەك باسی فیقهی پرسی بە ٣٠ هاوەڵی پێغەمبەر کردووە، ئینجا دواتر فتوای پێداوە ، کەچی لەولاوە کەسانی جاهل دێن و دەڵێن هیچ نییە قسەیەکی کردووە نەیپێکاوە ،ڕاستە زۆرێک لە هاوەڵان لە بابی فیقهی ڕاجیاییان هەبوو، بەڵام هەموویان لە باسە عەقیدەییەکان یەکدەنگ و متفق بوون ، ناکرێ و هەرگیز ڕوویندەداوە هاوەڵێکی بەڕێز لە ڕووی بیروباوەڕەوە پێچەوانەی ئەوانی تری کردبێت.

(١) سير أعلام النبلاء للذهبي .

گێڕانەوەی سێیەم لە إبن عباس:

خطيب البغدادي هێناویەتی دەڵێت : عَنْ يَعْلَى بْنِ حَكِيمٍ ، عَنْ عِكْرِمَةَ ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ : " لَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قُلْتُ لِرَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ : هَلُمَّ فَلْنَسْأَلْ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَإِنَّهُمُ الْيَوْمَ كَثِيرٌ ، قَالَ : وَاعَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ ، أَتَرَى النَّاسَ يَفْتَقِرُونَ إِلَيْكَ وَفِي النَّاسِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ فِيهِمْ ؟ قَالَ : فَتَرَكَ ذَاكَ ، وَأَقْبَلْتُ أَنَا أَسْأَلُ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْحَدِيثِ ، فَإِنْ كَانَ لَيَبْلُغُنِي الْحَدِيثُ عَنِ الرَّجُلِ فَآتِي بَابَهُ وَهُوَ قَائِلٌ ، فَأَتَوَسَّدُ رِدَائِي عَلَى بَابِهِ تُسْفِي الرِّيحُ عَلَيَّ مِنَ التُّرَابِ ، فَيَخْرُجُ ، فَيَقُولُ : يَا ابْنَ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ ، مَا جَاءَ بِكَ ، أَلا أَرْسَلْتَ إِلَيَّ فَآتِيكَ ، فَأَقُولُ : أَنَا أَحَقُّ أَنْ آتِيَكَ ، فَأَسْأَلُهُ عَنِ الْحَدِيثِ ، قَالَ : فَعَاشَ ذَلِكَ الرَّجُلُ الأَنْصَارِيُّ حَتَّى رَآنِي ، وَقَدِ اجْتَمَعَ النَّاسُ حَوْلِي يَسْأَلُونِي ، فَيَقُولُ : هَذَا الْفَتَى كَانَ أَعْقَلَ مِنِّي".

دەڵێت : کاتێک پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وەفاتی کرد ، بە یەکێک لە پیاوانی پشتیوانان ( أنصار )م گوت : وەرە با بڕۆین پرسیار لە هاوەڵانی

پێغەمبەر بکەین ، چونکە ئەمڕۆ ئەوان ژمارەیان زۆرە ، گوتی : ئای لەتۆ إبن عباس ئایا تۆ پێت وایە کەوا خەڵك پێویستیان بەتۆ بێت(بۆ زانستی شەرعی) لەکاتێکدا لەنێو خەڵکیدا هاوەڵانی پێغەمبەری تێدایە صلی الله علیه وسلم،

منیش وازم لێی هێنا و خۆم دەستم کرد بە پرسیارکردن لە هاوەڵانی پێغەمبەر بۆ ( حەدیث )، کاتێ فەرموودەیەکم پێدەگەیشت لە یەکێک لە هاوەڵان دەڕۆیشتم بۆ لای لە بەردەگا دادەنیشم و عەباکەی خۆم دەکردە سەرین و بایەکەش خۆڵەکەی دەهێنا بەسەرمدا ، تا کابرا دەردەچوو کە منی دەبینی دەیگوت : ئەی کوڕی مامی پێغەمبەر بۆچی هاتوویت ئایا نەدەکرا بەشوێنم دا بنێری و خۆم دەهاتمە خزمەتت ، ئەویش دەیگوت : بەڵکو من حەقترم بەوەی بێم بۆلات، ئینجا پرسیاری فەرموودەکەی لێدەکرد ، ئەو پیاوە ئەنصاریە ژیا و تاوەکو منی دەبینی کەوا خەڵك لە دەورم کۆبوونەتەوە و پرسیارم لێدەکەن ، دەیگوت : ئا ئەو کوڕە لەمن تێگەیشتووترە.[(١)]

---

(١) جامع لأخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب البغدادي ، باب أدب الأستئذان على المحدث ٢١٩ وە ابن سعد ٣٦٧,٣٦٨/٢ و الفسوي٥٤٢/١ وە سير أعلام النبلاء للذهبي .

## شیکردنەوە [ الكردي ]

دەڵێم چەند وردبوونەوە و تێڕامانێك لەو بەسەرهاتە گرنگ و پڕ بەهایەی کە إبن عباس خۆی بۆمان باس دەکات ، لەسەرەتا پێش هەموو شت پێویستە ئەوە بزانن ڕاستە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوعای بۆ کرد، بەڵام وەك بینیتان و بیستتان و خوێندتانەوە ، کەوا خۆی بە ماندووبوونی خۆی گەڕاوە و هەوڵی داوە تاوەکو خۆی شارەزا بکات لە دیندا، ڕاستە فەزڵی الله یە ، بەڵام پێویستی بە ماندووبوون و هەوڵدان هەیە ، بۆیە گەر بگەڕێینەوە بۆ ژیانی پێشەوایانی خیر القرون ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەڵێ ئەوان شەونخونیێ و ماندووونیان لەپێناو بەدەستهێنانی زانستی شەرعی کردووە و قوربانیان بۆی داوە.

## پێگەی إبن عباس لای التابعین:

### پێگەی إبن عباس لای طاووس بن کیسان:

لیث دەڵێت : بە طاووس بن کیسانم گوت: گەیشتی بە هاوەڵانی پێغەمبەر و وازت لێیان هێنا و هاوەڵێتی بچووکترینیانت کرد ؟

دەڵێ :پێیگوتم من گەیشتووم بە حەفتا هاوەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، کاتێ لە شتێک ناکۆک بوونایە لەکۆتاییدا دەگەڕانەوە بۆ وتەی إبن عباس.(١)

جا دەڵێت:

گەیشتووم بە **٥٠٠** هاوەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەر، کاتێ کەوا باسی إبن عباس کرابایە و پێچەوانەی کردبایە لە کۆتاییدا تەنها قسە قسەی ئەو دەردەچوو، یان دەگەڕانەوە بۆ قسەی ئەو.(٢)

---

(١) [التأريخ الكبير ج٥ لاپەڕە ٤]

(٢) سير أعلام النبلاء .

لە ریوایەتێکی تر طاووس دەڵێت : دانیشتووم لەنێوانی پێنج سەد تا حەفتا هاوەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ، کاتێ ئەوان پێچەوانەی إبن عباس یان دەکرد لە باسێکدا، جێگیر نەدەبوو هەتا ئەو کاتەی دەگەڕانەوە بۆ قسەی ئەو. [1]

إبن جریج ئەویش لە طاووس دەڵێ:

نەمبینیوە کەس هێندەی إبن عمر بەتەقواتر بێ و لە إبن عباس زاناتر بێت. [2]

شیکردنەوەی ئەو قەولەی پێشەوا طاووس.

بۆ تێگەیشتن لەو باسە پێویستەبگەڕێینەوە بۆ ژیانی پێشەوا طاووس بن کیسان الیماني کە یەکێکە لە پێشەوا هەرە دیارەکانی نێو تابعین و بزانین کێی بینیوە لەهاوەڵان.

ئەو ئیمامە بەڕێزە ساڵی لەدایکبوونی کەمێك ڕاجیایی تێدایە، هەندێك دەڵێن پێش خیلافەتی پێشەوا عثمان بن عفان واتە لە خیلافەتی پێشەوای

(١) (سیر سلف الصالحین ج١ /٤٨٢ )

(٢) تاريخ الفسوي " ١ / ٤٩٦، و" ابن سعد " ٢ / ٣٦٦.

بەڕێز عمر بن الخطاب لەدایکبووە، هەندێکی تر دەڵێن لە نێو خیلافەتی عثمان لەدایکبووە.

## دیارترین ئەو هاوەڵانەی کەوا پێشەوا طاووس پێیان گەیشتوە بریتین لە:

زَيْدِ بنِ ثَابِتٍ و دایکی ئیماندارن عَائِشَة و أَبِي هُرَيْرَةَ و زَيْدِ بنِ أَرْقَمَ و ابْنِ عَبَّاسٍ کە دیارترین مامۆستاکانیەتی، هەروەها ریوایەتی لەجَابِر بن عبدالله الأنصاري و وَسُرَاقَةَ بنِ مَالِك و صَفْوَانَ بنِ أُمَيَّةَ وابْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو بن العاص زِيَادٍ الأَعْجَمِ وحُجْر زۆرێکی تر کردووە.

## وردبنەوە ئەو هاوەڵانە بەتایبەت هەریەك لە:

١ / زَيْدِ بنِ ثَابِتٍ.

٢ / دایکی ئیماندارن عَائِشَة.

٣ / أَبِي هُرَيْرَةَ.

٤ / ابْنِ عُمَرَ.

٥ / عَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو بن العاص.

٦ / جَابِرِ بن عبدالله الأنصاري.

ئەو شەش هاوەڵە بەڕێزە لەڕووی زانست و فقهـ ەوە لەسەروی زۆرینەی زۆری هاوەڵانی ترەوەن، بەشێکی گرنگ و گەورەی نێو دینن، دەتوانم بڵێم سەدا ٩٠ هەموو فەرموودەکانی ئوممەت لەو هاوەڵانەوەیە جگە لە فیقهـ ،

تەنها زيد بن ثابت و عائشة و أبي هريرة زووتر وەفاتيان كردووە، گەر نا إبن عەباس و إبن عمر و إبن عمرو و جابر وەفاتيان نزيك يەكبوو ،

واتـە پێشەوا طاووس دەڵێت : هەموو ئەو هاوەڵانەی کەوا من بينيومە وەك لەسەرەوە بينيتان كۆمەڵێ لە زاناترينی نێو هاوەڵانی بينيوە ئينجا دەڵێت : کاتێک لەشتێک ڕاجياييان دەبوو لەگەڵ إبن عباس لەكۆتاييدا هەر دەگەڕانەوە بۆ قسەی عبدالله بن عبَّاس.

کەواتە لەوە بۆمان روون دەبێتەوە پێشەوا و موفەسسیری ئوممەت إبن عەباس یەکێک بووە لەدیارترینی نێو هاوەڵان لەڕووی علومی شەرعیەوە و لەسەرووی زۆرێکیان بووە، جگە لەوەی فەزڵی ئالوبەیت هەیە بەسەر ئەوانی تر.

## پێگەی إبن عباس لای مسروق بن عبدالرحمن:

پێشەوا مسروق دەڵێ:

من کاتێ إبن عباس م ببینیبا دەمگوت : جوانترینی کەسەکانە ،

کاتێ دەدوا دەمگوت : زمان پاراوترینی خەڵکە، کاتێکیش قسەی بۆ دەکردین دەمگوت : زاناترین کەسە.

## پێگەی إبن عباس لای عطاء بن أبي رباح:

وعن عطاء بن أبي رباح: إنه كان إذا حدث عن أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: حدثني فلان، وحدثني فلان، فإذا حدث عن ابن عباس قال: حدثني البحر.

عطاء بن أبي رباح ئەگەر فەرموودەی ریوایەت کردبایە لە هاوەڵانی پێغەمبەر رسول الله صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: بۆی باسکردم فلان و بۆی باسکردم فلان ، بەڵام کاتێ فەرموودەی لە إبن عباس باسبکردایە دەیفەرموو:

[حدثني البحر][1]

دەڵێم : ئەو قەولەی پێشەوا عطاء ئەوە دەردەخات کەوا إبن عباس لەڕووی زانسەوە لەسەرووی زۆرینەی هاوەڵان بووە، چونکە ئیمامی عطاء دەیەها هاوەڵی خاوەن زانستی پێغەمبەری بینیوە.

---

(١) طبقات الكبرى لإبن سعد ج٢/لاپەڕە ٢٧٩ وە سير أعلام النبلاء .

## پێگەی إبن عباس لای مجاهید بن جبر:

وعن مجاهد، قال: ما رأيت مثل ابن عباس، وأنه لحبر هذه الأمة.

پێشەوا و تابعی بەڕێز مجاهید بن جبر دەڵێت:

نەمبینیوە هاوشێوەی إبن عباس ئەو ( الحبر ) ی ئەوئوممەتەیە[١].

پێشەوا مجاهد بن جبر دەڵێ:

هیچ کەسێکم نەبینیوە هاوشێوەی إبن عباس بێت ، ئەو ڕۆژەی کەوا وەفاتی کرد ئەو (زانا)حبر ی ئەو ئوممەتە بوو[٢].

الأَعْمَشُ: عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ:

كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يُسَمَّى البَحْرَ؛ لِكَثْرَةِ عِلْمِهِ.

پێشەوا الأعمش ئەویش لە پێشەوا مجاهد دەڵێت:

بە إبن عباس یان دەگوت ( البحر ) بەهۆی زۆری زانستەکەی.[٣]

---

(١) قوله.ج١ /٤٨٢سير سلف الصالحين و إبن سعد ج٢/لاپەڕە ٢٨٠ .

(٢) الحاكم ٣ / ٥٣٥.

(٣) أنساب الاشراف " ٣ / ٣٣، وە" المستدرك للحاكم" ٣ / ٥٣٥، وە" الحلية الأولياء لأبي نعيم" ١ / ٣١٦

## پێگەی إبن عباس لای أبي وائل شقيق بن سلمة:

تابعی بەڕێز أبو وائل کەناوی شقيق بن سلمة یە دەڵێ:

إبن عباس وتارێکی بۆ داین کە ئەوکات ئەمیری مەوسمی حەج بوو ، لە سورەتی النور دەستی پێکرد و دەیخوێند و تەفسیری دەکرد بۆمان ، منیش دەمگوت : هەرگیز نەبینیومە و نەگوێشم لەقسەی هیچ پیاوێک بووە هاوشێوەی ئەو ، گەربێت و ڕۆم و فارس و تورك ، گوێیان لێبووایە ئەوا موسڵمان دەبوون.[١]

پێشەوا طاووس بن كيسان رحمه الله تعالى دەڵێت:

هیچ کەسێکم نەبینیوە هاوشێوەی إبن عباس بێت لە بەگەورە دانانی ئەو حەڕامکراوانەی کە الله عزوجل دایناوە.[٢]

(١) أنساب الاشراف " ٣ / ٣٨، و" المستدرك للحاكم " ٣ / ٥٣٧، و" الحلية الأولياء لأبي نعيم " ١ / ٣٢٤ و سير أعلام النبلاء للذهبي.

(٢) الحلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني ٣٢٩/١. وه سير أعلام النبلاء للذهبي .

قَالَ سُفْيَانُ بنُ عُيَيْنَةَ: لَمْ يُدْرَكْ مِثْلُ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي زَمَانِهِ، وَلاَ مِثْلُ الشَّعْبِيِّ فِي زَمَانِهِ، وَلاَ مِثْلُ الثَّوْرِيِّ فِي زَمَانِهِ.[1]

الذهبي لە سير هێناویەتی دەڵێت : علي إبن المديني دەڵێ:

إبن عباس لە ساڵی ٦٧ یان ٦٨ هیجری وەفاتی کردووە.

هەریەك لە الواقدي و الهيثم و أبو نعيم دەڵێن : ٦٨ هیجری وەفاتی کردووە.

دەڵێن ٧١ ساڵ ژیاوە.

(١) (سير أعلام النبلاء للذهبي )

## ئـایا إبن عبّاس تـامرد لە فتوای حەڵاڵی موتعە مایەوە ؟

قسەو باسێکی زۆر هەیە ، زۆر لە نەیارانی سوونندەت و شوێنکەوتەی سەلەف کاتێک وەڵامی گومڕاییەکانی شێخەکانیان لە متأخرین دەدرێتەوە دێن و دەڵێن : ( تأویل ) یان هەیە یان دەڵێن ( عوذر) یان هەیە و ئەوەتا إبن عباس موتعەی حەڵاڵ کردووە و (قدامة بن مظعون)

ئارەقی حەڵاڵ کردووە ؟

ئەوانە گومان و شوبهەکەیانە، بەڵام لە هەردووکی بەهەڵەداچوون وەکو بووختانێک وایە بەو هاوەڵە بەڕێزانەوە، سەبارەت بە قدامە ئێرە جێگای نییە، بەڵام ئەو بەهیچ شێوەیەک حەڵاڵی نەکردبوو، بەڵکو تێگەیشتنی ئایەتەکەی بەهەڵە وەرگرتبوو و دواتر جەڵد کرا و تۆبەشی کرد ، نەک بێت و بڵێ حەڵاڵە و نکوڵی بکات.

سەبارەت بە هاوەڵی بەڕێز عبدالله بن عباس بەڵێ ڕاستە لەسەرەتادا وای دادەنا کەوا ( موتعە ِ) حەڵاڵە بەهۆی فەرموودەیەکی صحیح کە پێی

گەیشتبوو ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ دەیگوت : حەڵاڵە نەک بۆ هەموو کات و سات، بەڵکو دەیفەرموو : لەحاڵەتی ناچاری و جیهاد دا ،

هەروەها ئەو فتوایەیی إبن عباس بۆ ئەوە بوو چونکە وای دانابوو کاتێ لە فەتحی مەککە بۆ سێ ڕۆژ حەڵاڵ کرا بەردەوامە ، تا دواتر پێشەوا علي بۆی ڕوونکردەوە و قسەی پێگوت ، سەیرکەن و وردبنەوە لەو باسە

کاتێ دەڵێن : إبن عباس ئەو شتەی حەڵاڵ کردووە ، بەس دەمەوێ تێبگەن هەرکەسێک لەهەر پێگەو مەنزڵێک بێ گەر حەڵاڵ حەڕام بکات دەبێتە (مشرع - شەرعدانەر) پەنا بە الله زۆر مەترسیدارە ، بەڵام پێمخۆشە تەرکیز بکەن بۆچی هیچ کەسیک لە هاوەڵان تەکفیریان نەکرد یان تۆبەی پێ بکەن ، کاتێ بە إبن عمر دەڵێن : إبن عباس وا دەڵێ ؟ نکوڵی کردو گوتی نەخێر ابن عباس واناڵێ ، ئێمە دەڵێین : إبن عباس وایگوتوە، بەڵام دواتر پەشیمان بۆتەوە لێی بەبەڵگەی ئەوەی زۆرێک لە زانایان وادەڵێن.

پێشەوا  الترمذي لە سنن لە :

أَبْوَابُ النِّكَاحِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - بَابٌ : مَا جَاءَ فِي تَحْرِيمِ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ بەژمارە ١١٢١ دوای هێنانی فەرموودەی حەڕامی زەواجی موتعە دەڵێن : وَإِنَّمَا رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ شَيْءٌ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي الْمُتْعَةِ، ثُمَّ رَجَعَ عَنْ قَوْلِهِ ؛ حَيْثُ أُخْبِرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە : گێڕدراوەتەوە لە إبن عباس ڕێگەی دابێت بە موتعە ، ئینجا دواتر لێی پاشگەز بۆتەوە لەو قەولەی ( فتوایەی ) کاتێک بۆی ڕوون بۆتەوە و هەواڵیان پێی داوە لە پێغەمبەرەوە لە حەڕامیەتی . واتە وەک پێشتر باسمان کرد دەکرێ بێ ئاگا بووبێت چونکە پشتی بەفەرموودەی صحیح بەستووە، بەڵام نەیزانیوە نەسخ بۆتەوە ،،ئەمە بەڵگەیەکە لەلایەن یەکێک لە پێشەوا گەورەکانی سەلەف و ئوممەت ئیمامی ترمذي.

هەروەها پێشەوا ترمذي بەڵگەیەکی تری هێناوە تایبەت بەشگەزبوونەوەی هاوەڵی بەڕێز إبن عباس بەو شێوە :

عَنِ  ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ : إِنَّمَا كَانَتِ الْمُتْعَةُ فِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ كَانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ الْبَلْدَةَ لَيْسَ لَهُ بِهَا مَعْرِفَةٌ، فَيَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ بِقَدْرِ مَا يَرَى أَنَّهُ يُقِيمُ،

فَتَحْفَظُ لَهُ مَتَاعَهُ، وَتُصْلِحُ لَهُ شَيْئَهُ، حَتَّى إِذَا نَزَلَتِ الْآيَةُ : { إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ } ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : فَكُلُّ فَرْجٍ سِوَى هَذَيْنِ فَهُوَ حَرَامٌ [١].

لەڕووی سەنەدەوە رجالەکانی هەمووی ثقەن تەنیا( مُوسَى بْنِ عُبَيْدَةَ )

نەبێت کەوا قسەی لەسەرەو زانایان بەلاوازیان داناوە ، بەڵام ئەوەی جێگای تێڕامانە پێشەوا ترمذي ئەم ریوایەتەی وەک پاڵپشتی بۆ پاشگەزبوونەوەی إبن عباس هێناوەتەوە ، واتە بەلای ئەووەوە إبن عباس لەو فتوایەی پەشیمان بۆتەوە.

هەروەها بەیهەقی لە سعيد بن جبير هێناویەتی ، عن ابن عباس، أنه قال في المتعة: " هي حرام كالميتة والدم ولحم الخنزير "[٢]

واتە : لەبارەی زەواجی موتعەوە دەڵێ : حەڕامە وەکو چۆن (مردو و خوێن و گۆشتی بەراز ) حەڕامە .

(١) ( سنن الترمذي ١١٢٢ )

(٢) ( سنن الكبرى للبيهقي ١٤١٦٧ )

هەروەها أبو عوانة لە مستخرج هێناویەتی لە عمر بن عبد العزیز ، دەڵێ: إبن عباس وەفاتی نەکرد تاوەکو لەو فتوایەیی پاشگەز نەبۆوە.

واتە نەمردوو تاوەکو زەواجی موتعەی پێ حەڕام بووە.

هەروەها ( البغوي ) لە شرح السنة هێناویەتی دەڵێ:

ڕاسترین ریوایەت لە إبن عباس ئەوەیە کەوا پاشگەز بۆتەوە بۆ حەڕام کردنی . ( واتە پێی حەڕام بووە ).[1]

إبن تیمیة دەڵێ : ریوایەت کراوە لە إبن عباس کەوا پەشیمان بۆتەوە لێی کاتێ نەهیەکەی پێدەگات.[2]

هەروەها إبن حجر دەڵێ : ریوایەت کراوە لە إبن عباس کەوا پەشیمان بۆتەوە پێش وەفات کردنی لەو فتوایە.[3]

ئەوە بەشێک بوون لەوانەی پێیان وایە کەوا إبن عباس لەسەر ئەو فتوایە نەماوە و لێی پاشگەز بۆتەوە.

---

(١) شرح السنة ج ٩ ص ١٠٠ : "

(٢) ( منهاج السنة لا ١٥٦ ج٢ )

(٣) ( "تلخيص الحبير" ١٥٨/٣ )

# فهرست